حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# خواندن و رێزمانا کوردی

## بـــۆ
## پۆلا شەشێ بنەڕەت

**بەرهەڤکرنا لیژنەکێ ل وەزارەتا پەروەردێ**

بژارکردنی
سادق ئەحمەد عوسمان روستایی
مەجید محەمەد سەعید باجلۆری
ئەسعەد حامد محەمەد
سەلیم عەلی عومەر وەرمێلی

پێداچوون
لیژنەیەك ژ رێڤەبەریا گشتییا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ

چاپا هەشتێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# خۆشتڤی



خۆشتڤیاتی دلەکێ فرەهـــەیە، پڕە ژ حەزو هیڤیو خۆشیێن ژیانێو، ژکویراتییا دەروونێ مرۆڤی پەیدا دبیتو مەزن دبیت و، ژدیتنا چاڤان دیار دبیت.مرۆڤ د رێیا خۆشتڤیاتییێدا هیڤییا ژیانێ ل بەر چاڤان فرەهدبیت و ستێرا خۆشییێ گەش دبیت و دل ب هێزدبیتوباوەری موکم دبیت خۆشتڤییە خودانی دکەتە مرۆڤەکێ شارەزاو پاقژو خزمەتکار،
هەمی دەمان ژ دوو دلییێو بێ ئومێدییێ دوور دئێخیت، هەر دەمەکێ خۆشتڤی دناڤ مللەتیدا بەلاڤە ببیت، هەمی ب کەیفو خۆشی دێ ژینو دێ بنە ژێدەرێن هێزو شیانان، وەکی شانەکا مێشێن هنگڤینی مللەت پڕی خۆشیو ژیانو هاریکاریو ئێکو دووگرتنو رێکا پێشکەڤتنێ دێ رووهن تر بیت، ئەگەر خۆشتڤییا ئاخێ نەبیت، چەوا مرۆڤ دێ گیانێ خۆ ژ بۆ پاراستنا وێ کەتە قوربان .

## راهێنان (١)

ڤان ڤالاهیێن ل خوارێ ب پەیڤەکا گونجای پڕ بکە:

١. خۆشتڤیاتی دلەکێ .................. .

٢. .................. هیڤییا ژیانێ لبەر چاڤان رووهن تر دکەت.

٣. هەر دەمەکێ خۆشتڤی بەلاڤەبوو دێ ب .................. .

٤. ئەگەر خۆشتڤییا ئاخێ نەبیت دێ چەوا .................. .

## راهێنان (٢)

### دانوستاندن

١. مرۆڤ کەنگی دێ گیانێ خۆ کەتە قوربان بۆ ئاخا خۆ؟

٢. خۆشتڤییا دایبابان بۆ زارۆکان جۆرەکێ خۆشتڤییێیە، دێ کاری چەند جۆرەکێن دیێن خۆشتڤیاتییێ بەحس بکەی؟

٣. خۆشتڤی ئەگەر دناڤ مللەتەکیدا بەلاڤە بیت دێ چەوا ژیت؟

## راهێنان (٣)

خویندکارێ خۆشتڤی ڤێ رێزال خوارێ سێ جاران بنڤیسە:

( باشییێ بکە ، هەمی باشی جوانە)

## راهێنان (٤)

قوتابییێ خۆشتڤی چەند رێزەکان لسەر خۆشتڤییا دایبابان بنڤیسە.

## راهێنان (٥)

هەڤدژێ ڤان پەیڤێن خوارێ بنڤیسە:

( کویراتی، شرینی، خۆشتڤی، باشی )

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| فرەهـ | : | فراوان |
| ژێدەر | : | سەرچاوە |
| دێ کاری | : | دێ شێی |

# ناسناما نەتەوەیی

هەر دەمێ پرسیارێ ژتە بکەن تۆ کی؟

دکاری ناسناما خۆ نیشا بدەی یان بەحسێ خۆ بۆ بکەی.

ئەگەر دەربارێ نەتەوەیی پرسیار هاتەکرن، نەتەوە چییە؟

دبەرسڤێدا: ل جهێ ناسنامێ، شارەزاو نڤیسەرو نیگارکێش سازڤانو سیاسەتمەدارو هونەرمەندان دێ نیشا دەی. مرۆڤ دڤێت، ل دەسپێکا گەنجاتیا خۆ وەسا تێ بگەهیت، بۆ وێ هاتییە دۆنیایێ ببیتە نوینەرێ گەلێ خۆو بۆ ئەنجامدانا ڤان ئەرکو رۆلان پەروەردە ببیتو تێ بگەهیت.

## راهێنان (١)

قوتابییێ خۆشتڤی ژ مامۆستایێ خۆ بپرسە ناسناما نەتەوەیی چییە؟

## راهێنان (٢)

قوتابییێ خۆشتڤی چەند رێزەکان لسەر ڤێ رێزا ل خوارێ بنڤیسە:
وەك (دارشتن)

ئەرکێ مرۆڤی بەرامبەر ئاخو نەتەوەیا مرۆڤی چییە؟

# نــــــــــــەورۆز



نەورۆزە گەلێ ئاری

رۆژا ئازادیێ هــــــــەلات

بیستو ئێکێ ئادارێ

جەژنو سەرسال بوون خەلات

** **

باپیرێ مەزنێ ئاری

ئەوی کاوەیێ ئاسنگەر

رۆژا گەشا ئازادیێ

ژتاریا شەڤێ ئینـــادەر

** **

ئاگر هەلکرن سەرێت چیا

لسەربانو سەرێت ری یا

گوندو باژارو کولانا

گەل کەتن شاهیو دیلانا

هۆزانڤان: شەعبان سلیمان ل سالا ١٩٦٥ ل سەر سنکێ قەزا ئامێدیێ هاتیە دونیایێو، دەرچوویێ ئامادەیا خواندنێن ئیسلامییە ل دهوکێ، نوکەژی ئاکنجیێ باژێرێ دهوکێیە.

# راهێنان (١)

ڤان ڤالاهییێن ل خوارێ پڕ بکە:

١. ................ گەلێ ئاری.

رۆژا ئازادییێ هەلات.

٢. بیست‌و ئێکێ ................ .

٣. جەژن و سەر سال بوون ................ .

٤. ................ ئاری.

٥. رۆژا ................ ئازادییێ.

٦. ژ تاریا شەڤێ ................ .

٧. ................ هەلکرن سەرێت چیا.

٨. ل ................ و سەرێت ری یا.

٩. ................ کەتن شاهی‌و دیلانا.

# خەڵاتێن نۆبل



ئەلفریدو نۆبل زانایەکێ سویدیە ل ساڵا (١٨٣٢)ی زایینی ل وەلاتێ سویدێ ژ خێزانەکا هەژارو کێم درامەت ژ دایکبوویە، ل خواندنگەهێ نە خواندییە بەلێ لسەر دەستێ مامۆستایێ تایبەت ل مالا خۆ فێری خواندنێ بوویە. دەمێ گەهشتیە ژیێ گەنجاتیێ چوویە وەلاتێ ئێککرتیێ ئەمریکاو ساڵەکێ ل وێرێ مایە، دەمێ زڤرییەڤە ئەوروپا، دگەل بابێ خۆ پێکڤە دەست ب تاقیکرنێ کر لسەر تەقەمەنییان.

دەزگەهەکێ بچووک بۆ بەرهەم هێنانا مادێ (نیترۆگلیسرین) چێکر، ئەڤ ماددە زوو بلەز دپەقیت، ژبەرڤێ نۆبل هندەک ماددێ تایبەت بۆ بکارئینانا دینامێتی چێکر.

چەندین کارگەهێن بەرهەم هێنانا دینـــامێتی ل ئـــەوروپا دامەزرانــدن‌و بڤێ رێکێ مالەکێ زۆر ب دەستڤەئینا.



نۆبل ژبلی زمانێ سویدی چەند زمانێن دی ژی دزانی. پێ نەخـــۆش بوو دەمێ دینامێت چێکری، ژبـــەرڤێ پـــشتگیری ل رێکخـــراوێن ئاشـــتیێ کرییە، پێخەمەت ئاشتیێ ل ئەوروپا کاردکر. ل ســالا (١٨٩٦)ێ زایینـــی چوویە بەر دلوڤانییا خۆدێ. مالـــەکێ زۆر ل پـــشت خـــۆ هێلایـــە. لســـەر وەســیەتا وی ژمفــایێ وی مـــالی پێـــنج خـــەلات بهێنـــە دابینکـــرن بـــۆ وان شـــارەزایێن دبـــوارێ نـــۆژداری‌و کیمیـــاو سروشـــت‌و ئـــەدەبی‌و جیهـــانی‌و دۆستایەتی دناڤبەرا وەلاتانداو خزمەتا مرۆڤایەتی کرییە.

نۆکەژی هـــەر ســـال ل بـــاژێرێ (ستۆکهۆلـــم) ل رۆژا ڤـــی زانـــای مـــال ئاڤایی کری‌و لدویڤ وەسیەتاوی کۆمەکا زانایێن سویدی خـــەلاتێن بـــارێ زانستی‌و ئەدەبی لسەر چەند زانایێن ژ هەژی‌بەلاڤ دکەن. بتنـــێ خـــەلاتێ

ئاشتییێ نەبیت کو دێ لدووف راسپاردێن پێنج کەسان ژ پەرلەمانێ (نەرویج) هێتە هەلبژارتن، چونکە لسەر دەمێ نۆبل سویدو نەرویج ئێك وەلات بوون.

خەلاتێ ویژی پێکهاتییە ژ مەدالیەکا زێڕیو باوەڕنامەکێو دوازدە هزار جونەیهێن ئەسترلینی.

ئێکەم خەلاتێ نۆبل بۆ ئاشتییێ ل سالا (١٩٠١)ی زایینی دایە (جان هنری دونان) دامەزرێنەرێ دەستەیا خاچا سوور. چەند خۆشە و جهێ سەربلندییێیە بۆمە کوردان ، ئەگەر رۆژەکێ مەگوهـ ل زانایەکێ کورد ببیت، د بوارێ زانستێدا خەلاتێ نۆبل وەرگریت.

## راهێنان (١)

بەرسڤا راست هەلبژێرە:

١. ماددێ نیتروگلیسرین ................ دپەقیت.

زۆر درەنگ، زوو بلەز، ب ئاگری

٢. نۆبل ژ مالەکا ................ ژ دایک بوویە.

دەولەمەند، دەرەبەگ، کێم درامەت

٣. نۆبل سالۆکێ ل ................ مایە.

ئەوروپا، وەلاتێ ئێککگرتیێ ئەمریکا، کەنەدا

٤. ژبەر چێکرنا دینامێتی نۆبل پشتەڤانیێ ل................ دکەت.

رێکخراوێن ئاشتیێ، رێکخراوا خاچا سوور، رێکخراوا نەتەوێن ئێککگرتی.

٥. خەلاتێ ئاشتیێ لدویف راسپاردێن پێنج کەسان ژپەرلەمانێ ................ ددەنێ.

دانیمارك، سوید، نەرویج

# مەلا مستەفا بارزانی



سەرۆک و رێبەرێ بزاڤا رزگاری خوازا کورد مـەلا مـستەفا بـارزانی کورێ شێخ محەمەد کورێ شێخ عەبدولسەلام بارزانییە، ل رۆژا چواردەی مەها ئادارا سالا ۱۹۰۳ زایینی ل گوندێ بارزان هاتییە دونیایێ. بەری ژ دایـك بیت شێخ محەمەدێ بابێ وی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ دایکا وی بێ بـاب خودان کرییە. دەمێ ژیێ وی بوویە سێ سالێ، شـێخ عەبدولـسەلام برایـێ مەزن ناسیارە ب شێخ عەبدولسەلامێ دووێ ب سـەرهەلدانێ رابـوو دژی دەولەتا عوسمانیانو سـوپایێ وێ دەولەتێ ژی هێـرش برنـە سـەر بـارزانو هەمی گرتن، مەلا مستەفا دگەل دایکا خۆ بەر ڤێ هێرشێ کەڤتنو نەهـ هەیڤان مانە دگرتیخانێدا، ل سالا ۱۹۳۱و ۱۹۳۲ی زایینی مەلا مـستەفا

هاریکاریێ شێخ ئەحمەدێ برایێ خۆ بوو ل سەرهلدانا دژی حکومەتا عیراقێ، دیسان ل سالاێ ۱۹٤۳و ۱۹٤٥ی زایینی بارزانی شۆڕەشا دووێ هەلکر، لیژنەکا سیاسی بۆ رزگارکرنا کوردستانێ ب ناڤێ (لیژنا ئازادی) ب سەرۆکاتییا خۆ دامەزراند، دڤێ شۆڕەشێدا چەند شەڕو ئاگربەست دگەل حکومەتا عیراقێ هاتنە کرن، ل سالاێ ۱۹٤٥ی زایینی بارزانیو هەڤالێن خۆ چوونە کوردستانا ئیرانێ مل ب ملێ خەباتکەرێن رزگاری خوازێن کوردستانا رۆژهەلات کەڤتنە قادا خەباتێ و پشکداری ددامەزراندنا کۆمارا دیموکراتییا مهابادێدا کرن، بازرانی بوویە سەرۆکێ سوپایێ پاریزگارییا ڤێ کۆمارێ. پلەیا جەنەرالی وەرگرتبوو. دەمێ کۆمارا مهاباد ژناڤچووی بارزانییێ نەمر ل سالاێ ۱۹٤۷ی زایینی چوو ئێکەتییا سوڤیەتی یا جاران و یازدە سالاًن ل ڤی وەلاتی دگەل هەڤالێن خۆ، بوونە پەنابەرێن سیاسی تاکو شۆڕەشا ١٤ی تەمووزا سالاێ ۱۹٥۸ی زایینی ل عیراقێ.

ل وی دەمی ژی سەرۆکێ بزاڤا رزگاری خوازا کوردستانێ بوو.

بەلێ چ جاران ب دلێ وی نەبوو بێژنێ سەرۆك، دڤیا ناڤێ وی بێژن. مەلا مستەفا، ڤی سەرکردێ نەتەوەیا کورد زانی حکومەتێن عیراقێ مافێ نەتەوەیا کورد نادەنێ. لەورا ل ١١ی ئەیلولا سالاێ ١٩٦١ی زایینی شۆڕەشا مەزنا ئەیلولێ دەسپێکر.

تاکو ١١ی ئادارا ١٩٧٠ حکومەتا عیراقیٚ نەچار بوو ریٚککەڤتنا ١١ی ئاداریٚ دگەل بارزانییٚ نەمر مۆربکەت. ئوتونومی دا کوردستانا عیراقیٚ. پشتی هینگیٚ حکومەتا عیراقیٚ کەڤتە داڤ ڤەدانیٚ لەورا ل ٦ی ئادارا ١٩٧٥ی زایینی ل جەزائیر ریٚکەڤتنامەکا خەیانەتکار مۆر کر، ئەڤی کاریٚ نە مرۆڤایەتی، زیانەکا مەزن گەهاندە شۆرەشا ئەیلولیٚ.

ل ئیٚکیٚ مەها ئاداریٚ سالا ١٩٧٩ بارزانی چوویە بەر دلوٚڤانیا خوٚدیٚ.

## راهێنان (١)

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. کەنگی بارزانی ژ دایك بوویە؟

٢. شۆرەشا ئەیلوولێ ل چ رۆژو هەیڤو سال دەسپێکر؟

٣. بارزانی کورێ کێ بوو؟

٤. بۆچی بارزانی شۆرەشا ئەیلوولێ بەرپاکر؟

٥. کی سەرۆکێ کۆمارا دیموکراتییا مهابادێ بوو؟

٦. ل چ رۆژو هەیڤو سال کۆمارا مهاباد هاتە دامەزراندن.

## راهێنان (٢)

ڤان ڤالاهیێن ل خوارێ ب پەیڤەکا گونجای پڕ بکە:

١. لیژنا ئازادی ب سەرۆکاتییا ................ هاتە دامەزراندن.

٢. بارزانییێ نەمر پشتی شۆرەشا ١٤ی تەمووز ١٩٥٨ی زایینی زڤڕییە ................ .

٣. رێککەڤتنا خەیانەتکارا جەزائیر ل ................ مۆر کرن.

٤. بارزانییێ نەمر کورێ ................ کورێ ................ .

٥. ل سالا ................ بارزانیو هەڤالێن خۆ چوونە کوردستانا ئیرانێ.

# پەرتووکەک بەحسێ خۆ دکەت





پەرتووکێ گۆت: حەفت هزار سالان بەری نۆکە ل ڤێرە ل ئاخا دیجلەو فورات ژ دایکبوویمە. ل دەسپێکێ خشتێن پانێن وەکی بەری بوون. پەرتووکخانێن وی سەردەمی ئەز هەلگرتبووم. دەستو چاڤێن دلسۆز ئاگەهداریا من دکرو ئەز دپاراستم. سال لدووڤ سالێ خزمەتا من دکر تا کو ئەز جوان بوویم ب رەنگێ کاغەزێ تۆمار کریم.

داب ساناهی بشێن من هەلگرنو بپارێزنو، ب نڤیسینەکا جوانو ب وێنەیێن رەنگاو رەنگو رەشو سپی خەملاندم، ددروستکرنا مندا کاغەزەکا سپیو نازک و چاپخانێن نوی بۆمن هەلبژارتن. ئەز ئەڤرۆکە ئێکم ژ تەمامکەرێن ژیانێ، ب هیچ رەنگەکی نابیت دەستان ژمن بەردەن.

بەرپەرێن من پڕن ژسەرهاتیو چیرۆکانو پەندێن پێشینانو ئاخڤتنێن خۆشو سەردەمو پەیامێن زانستیو سامانێ نەتەوایەتیو کەلەپوورێ بابو باپیران بخوڤە گرتییە، چ جاران ئەز نهێنیەکا کەسێ بەلاڤ ناکەم ئەگەر خۆدانێ وێ حەز نەکەت بەلاڤە ببیت. ئەز هەڤالەکا ب مفامە بۆ رۆژێن وە، ئەز دشێم دەمێ چوویو نۆکەو داهاتی بێخمەبەر دەستێ وە. مرۆڤایەتی ب رێکا من دگەهیتە قۆناغەکا بلند. دوژمنێ سەرەکی یێ پاشکەڤتنا هەر مللەتەکی نەخویندەوارییە.

## راهێنان (١)

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. ل کیڤە کتێب ژ دایك بوویە؟

٢. باشترین هەڤال بۆ مرۆڤی کییە؟

٣. ژبلی پەرتووکێن قوتابخانێ، تەدڤێت تۆ چ کتێبێن دی بخوینی؟

٤. تاکو نۆکە تە چەند پەرتووکێن دی خواندینە؟

## راهێنان (٢)

ڤان ڤالاهییان ب پەیڤەکا گونجای پڕ بکە:

١. پەرتووکێ گۆت ............ بەری نۆکە ل ڤێرە ل ئاخا............ ژدایک بوویمە.

٢. پەرتووکێ گۆت ئەز ئەڤرۆکە ئێکم ژتمامکەرێن ژیانێ نابیت ب هیچ رەنگەکی ................

٣. پەرتووکێ گۆت ئەز هەڤالەکا ب مفامە بۆ ................

٤. پەرتووکێ گۆت دوژمنێ سەرەکیێ هەرمللەتەکی ................یە.

## راهێنان (٣)

### ﴿ پەرتووک باشترین هەڤالێ مرۆڤییە ﴾

قوتابییێ خۆشتڤی چەند رێزەکا لسەر بنڤیسە.(وەك دارشتن)



# کەچا کورد

ئەی کەچێ رابە بخوینە دا تو سەربەست هەر بژی
زوو ژخەو تو سەر هلینە بەس بمینە بێ مەژی

رەنجبەرا هوندر تویی تم رندو ژیرو زانە بە
بۆتە پێتر هەر دڤێتن خوندەواری‌و پاقژی

وا هەڤالێن تە ل هەرجێ سەربلند پێشڤە دچن
رابە سەر خو ئەی‌کەچا کورد سەر بلند بمرە تو ژی

گەر بخوینی دێ بدێ خوەندن تو ئێ هوندر تەڤا
گەر نەخوێنی کەس ژ بۆمە ئێش‌و دەردا ناکوژی

وا جەگەر خوین خوەش دنالی دا کو ژن پێشڤە هەرن،
دا ببێژن هەر بژی کورد هەر بژی کورد هەر بژی

جگەر خوین

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| رابە | : | هەستە |
| ژ خەو | : | لە خەو |
| سەر هلینە | : | سەر بلند کە |
| بێ مەژی | : | بێ مێشك |
| هوندر | : | ناوماڵ، ناوخۆ |
| تم | : | هەمیشە ، هەمیگاڤا |
| بێتر | : | پتر، زێدەتر |
| دڤێتن | : | دەیەوێ |
| دێ بدێ خوەندن تو | : | تۆ خوێندەواری دەدەیتە |
| ئێ هوندر تەڤا | : | ئەوێن ل ناف ماڵێ هەمی |
| تەڤا | : | هەموو، هەمی |

# جـــوانی



جوانی دبەژنو باڵو لەشو روییێ رێکوپێکدایە، جوانی دهزرا رووهنو هەستا بلندو کریارا شرین دایە. جوانی دئاشتییێدایە، دخۆشتڤییێ و برایەتییێو ئێکگرتنێو هاریکارییێدایە. جوانی بۆ بەرەڤانی کرنێ دژی زۆرداریێ، دخەباتو بزاڤا هەمی لایەکیدایە.

بۆ نەهێلانا نەخوێندەوارییێو هەژارییێو وێرانکرنێیە، بۆ ئازادکرنا کوردانو ئاڤەدانکرنا کوردستانێو هاریکاریکرنا خەمگینو لێ قەومییێن جیهانێیە. جوانی دمەزناتییێدایە کو خەما بچووک دخۆت، دهزرو بیراندایە کۆچارەسەریا ئارێشان دکەت، دوێ هێزێ دایە، کو پاراستنا دادیێ دکەت، دخویندەوارییێدایە. کو نەخویندەوارییێ ژناڤ دبەت. دوێ مالێ دایە کو هەژاریو نەبوونێ ژناڤ دبەت، دنۆژدارییێدایە، کو چارەسەریا نەساخان دکەتو برینان دەرمان دکەت.

جوانی ددلتەرپێیدایە، کو ژیانا هەمییان تژییە ژ کەیفو خۆشیێ، جوانی دسروشتیێ رەنگاو رەنگیێ تژی مفادایە، جوانی دپێکڤە ژیانێدایە، دڤێت دەستیێ هاریکارییێ بۆ ئێکو دوو درێژ بکەین‌و، کوردەوارییەکا ئازادو پێشکەڤتی ل کوردستانەکا خەملاندی پێکبینین، تاکو ئەم ببینە ئەندامێن ب هێزو ب مفا.

## راهێنان

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. تۆ جوانییێ دچڕا دبینی؟
٢. چەوا تۆ جوانییێ وەکی چەکەکیێ دی بکار دئینی؟
٣. چەوا دیێ پەسەندکەی خویندەواری پشکەکەژ جوانییێ؟

# میژوویا دەرچوونا ئێکەمین رۆژنامەو گۆڤار ب زمانێ کوردی



عدد ١

عنوان

کردستان

١٣١٥

هەر سال ل ٢٢ی نیسانێ رۆژنامە نڤیس‌و خودان خامێن زێرین ب دلخۆشی جەژنا رۆژنامەڤانی‌و پەیڤێن رەسەنێن زمانێ کوردی پیرۆز دکەن، چونکی دڤێ رۆژێدا ل سالا (١٨٩٨)ی زایینی ئێکەمین رۆژناما کوردی ب ناڤێ (کوردستان)ێ ژدایك بوویە، ل سەردەستێ (مقداد مەدحەت بەدرخان) ل قاهیرە پایتەختێ میسرێ دەرکەڤتییە. ژوێ رۆژێ وەرە کاروانێ رۆژنامەڤانییێ‌و پەیڤێن رەسەنێن زمانێ کوردی دەست پێکریەو د قۆناغێن جودا جودا دا دەربازبوویە. تاکو گەهشتیە قۆناغا زێرینا ئەڤرۆ، بێگومان ژدایکبوونا ئێکەمین رۆژناما کوردی ب پلا ئێکێ سەروەریا وێ بۆ بنەمالا بەدرخانیان دزڤریتەڤە چونکی ئەو بنەمالا رێزدار هەمی دەمان خودانێن کەسانێن نیشتمانپەروەرو رووناکبیرێن سەردەمێ خۆ بوون. دەرکەڤتنا رۆژناما کوردستان ل دەمەکێ تایبەت بوو. چوویە ناڤ ژیانا

هشياريا نەتەوەیی و، پتر گرنگی ب زمانو ئەدەبو رەوشـنبیریو کـەلتوریٚ رەسەنیٚ کوردی دایە. وەسا ئێکـەمین گۆڤـارا کـوردی ل سـالا (١٩١٣)ی زایینی ب ناڤیٚ (بانگی کورد) ژلاییٚ (جەمال بابـان) دەرکەڤتییـە ئـەڤ گۆڤـارە تـاکو هەلبـوونا شـەرِیٚ ئێکـیٚ یـیٚ جیهـانی (٥) ژمـارە ژیٚ دەرکەڤتینە. بەلیٚ ئێکەم گۆڤارا کوردی ل میٚژوویارۆژنامەڤانیا کـوردی ب ویٚنیٚن فوتوگرافی بەلاڤکریەب ناڤیٚ (رۆژی کـورد) بـوو، ئەڤـەژی ل رۆژا (٦)ی خزیرانـیٚ سـالا ١٩١٣ی زایینـی ژلایـیٚ کۆمەلاٚ (هیڤـی) ڤـەل ئەستەنبول پایتەختیٚ دەولـەتا عوسمـانی دەرکەڤتییـە، بتنـیٚ (٣) ژمـارە دەرچووینە، خـودانیٚ ئیٚمتیـازیٚ (عەبدولکـەریم مـەحمود رۆسـتەم) بـوو ناسیارە ب (عەبدولکەریم شانو). رۆژنامەڤانییٚ رۆلەکیٚ ئێکجـار گـرنگ هەیە د ژیانا رەوشنبیریو شارستانیـا هەموو ملل‌ەتو نەتەوەیاندا و دڤیٚت ب رەنگەکیٚ دروست بهیٚنە بکار ئینان.

نۆکە رۆژانە ژمارەکا ئێکجار زۆرا رۆژنامان ل کوردستانیٚ دەردکەڤن.

## راهێنان (١)

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. ناڤێ ئێکەم رۆژناما کوردی چ بوو؟

٢. سالا چەندێ ئێکەم گۆڤارا کوردی دەرکەڤت وناڤێ وێ چ بوو؟

٣. کیژ گۆڤار بوو ب وێنەیێن فوتوگرافی دەرچووی؟

٤. خودانێ ئیمتیازا گۆڤارا رۆژی کورد کی بوو؟

## راهێنان (٢)

ڤان ڤالاهیێن ل خوارێ ب پەیڤەکا گونجای پڕ بکە:

١. ل رۆژا ............... ی سالا ............... گۆڤارا ............... دەرچوویە.

٢. ل سالا ............... ئێکەم رۆژناما کوردی دەرچوو.

٣. ئێکەم رۆژناما کوردی ژلایێ ............... دەرکەڤتییە.

٤. گوڤارا بانگی کورد ژلایێ ............... ە دەرچوویە.

## چالاکی (١)

پەیڤێن پەیوەندی پێکڤە هەین ب هێلەکێ بگەهینە ئێک:

| | |
|---|---|
| بانگی کورد | مقداد مەدحەت بەدرخان |
| رۆژناما کوردستان | جەمال بابان |
| رۆژی کورد | کۆمەلا هێڤی |

## چالاکی (٢)

ناڤێ (٥) رۆژنامێن کوردی بنڤیسە کو نۆکە دەردکەڤن .

# ماسییەکا بچووک



ماسییەکا مەزن دبنێ ئاڤێدا ب شانازیڤە دهات و دچوو، ژ دوورڤە کۆمەکا ماسیێن بچووک دیتن، ل ئێکو دوو کۆم ببوون.

ماسیێن بچووک ماسییا مەزن دیت.

ژترسان هەر ئێک ب لایەکیڤە رەڤی، ب تنێ ماسییەکا بچووک نەچوو لبەر دفنا ماسییا مەزن راوەستاو نەلڤی.

ماسییا مەزن ئەڤ چەندە ژلایێ وێڤە سەیر بوو، بەرەف ماسییا بچووک چوو و گۆتی:

دبینم تو وەکی ماسیێن بچووکێن هەڤالێن خۆ نەبووی!

کو چاڤێن وان ب من کەڤتن هەر ئێك ژوان ب لایەکیڤە رەڤی.

ماسییا بچووک گۆت:

چ پێدڤییە ژتە بترسم؟

ماسیيا مەزن ب تۆڕەییڤە گۆت:
ئەرێ ژمن ناترسی تە بخۆم؟
ماسیيا بچووک بێ کو خۆ تێکبدەت گۆت:
چ چاران ژتە ناترسم.
بەلێ کێماسییە بۆتە، ئەزو ماسییێن بچووکێن هەڤالێن خۆ ژتە بترسین؟
ماسیيا بچووك لسەر ئاخڤتنێن خۆ چوو و گوت:
سەیرە ماسی ژماسیێ بترسیت چونکی هەردوو ماسینە.
ماسیيا مەزن ژ ئاخڤتنێن ماسیيا بچووك حێبەتی بوو د دلێ خۆدا گوتی:
ئاخڤتنێن ماسیيا بچووك گەلەك نێزیکی راستییێنە.
بۆچی ماسیيا مەزن ماسیيا بچووك بخۆت؟ ما ئەو ژی ژمە نینن؟
ماسیيا مەزن رۆژەکێ ژ رۆژان ئەم ژی وەکی ڤان (بچووك بووین) بۆ مە نەخۆش بوو ماسییەکا مەزن مە بخۆت.
ئەگەر ماسییەکا مەزن ئەم خواربایین، نوکە دا ئەم ل کیڤە بین؟ ئەم ئەڤ ئەژدەهایێن مەزن!.
دوی دەمیدا ماسیيا مەزن ماسیيا بچووک ب جهـ هێلاو چوو و، ددلێ خۆدا هەر هزر ل ئاخڤتنێن ماسیيا بچووک دکرن.
بڕیاردا هەتا هەتایێ ماسییێن بچووک نە خۆت.

## راهێنان

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. بۆچی ماسیێن بچووک هەر ئێک ب لایەکیڤە ڕەڤین؟

٢. ئەو ماسیيا بچووك یا نەترسای چ گوتە ماسیيا مەزن؟

٣. دوماهیك بڕیارا ماسیيا مەزن چ بوو؟

٤. ناڤێ هندە جۆرێن ماسیيان بێژە؟

# سەدەی زانست

ڕەوشـــــت، زانســـت، پـــەروەردە
هەتـوانـــی زامـــــی کـــوردە
مـــرۆڤ بـــەبیـــرو زانـــــست
هەوڵـدان، تـەکـان، تـوانـسـت
تـێدەگـا... چۆن دنیـای نـوێ...
هـــەر ڕۆژەو داهـێنانــــــێ
جـۆرە بـەرهـــەم هـێنـانــێ
زۆربـــوونـــی ئـــامـێرەکـان
گەشت بـەرەو ئــەستـێرەکـان
(کۆمپیـوتـەر)و (ئـینتەرنێت)
نـەزانـین لـە گـۆڕ ئـــەنێت
هـەنـگـاوی (فـۆتـۆکـۆپـی)
شـــۆڕشــە دژ بـــەکــــپـی
ئەمـــانە گشـــتی بــۆ گــەڵ
مـــایـەی سـوودن بـۆ کۆمـەڵ
ڕۆڵـەی کـوردم، بــا ئێمـەش
لـەم ڕەوتـە نـەبین بـێ بەش
مـێژوو لــە (هــەزارەی ســێ)
بـەزێـڕ نـاومـــان بـنووسێ



(عەلی بەختەوەر)

# واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| هەتوان | : | چارە ، چارەسەر ، دەرمان |
| نانەوێ | : | ناچەمێ |
| داهێنان | : | دروستکرن ، ئافراندن |
| گەشت | : | سەفەر ، گەریان |
| لە گۆڕ ئەنێت | : | لەناو دەبات، ژناڤ دبەت |
| هەنگاو | : | پێنگاڤ |
| کپی | : | بێدەنگی ، خامۆشی |
| تەکان | : | داقوتان، پالدان |
| توانست | : | شیان |

# کۆمپیۆتەر

## بەش‌و پارچێن کۆمپیۆتەری



زارۆکێن خۆشتڤی، (کۆمپیۆتەر) ئامێرەکە ب وزا کارەبێ کار دکەت، ب شێوەکی ژلایێ زاناڤە هاتییە چێکرن، کارو فەرمانێن مرۆڤی زۆر ب هووری بلەز ئەنجام ددەت.



کۆمپیۆتەر ژ چەند بەش‌و پارچان پێکهاتییە ئەڤەنە:

### (کەیس) (سندوقا کۆمپیۆتەری):

ب شێوێ سندوقەکێ هاتییە چێکرن، شێوێ ستوونی‌و ئاسۆیی یێ هەی، بەشێ سەرەکی (کۆمپیۆتەر)ە چونکی هەمی بەش‌و یەکەیێن وێ یێن سەرەکی تێدا هەنەو، جهێ کارکرنا (سی دی)و دوگمێ هەلکرنێ‌و ڤەمراندنا کۆمپیۆتەر تێدا هەیە، هەروەسا جهێ پێگڤە گرێدانا هەمی دەزگەهێن وی هەیە.

## ( مۆنیتەر ) ( شاشە ):



ژ بلـی وایـەرو کێبلـێ وزا کـارەبێ ب وایــــەرەکا تایبــەت ب (کەیس )ی هاتیە گرێدان، بـۆ دیتنـا وان هـەمی ئــەنجامو کــاران بکاردهێــت ئــەوێن کۆمپیۆتەر ئەنجام ددەت.

## ( کیبۆرد ) ( بۆردێ دوگمان ):



کیبۆرد ب شێوێ تەختەکێ دوگمەدارە، چونکی کۆمەکا دوگمان ل سەرە، هندەک ژڤان دوگمان تایبەتن بۆ پیتێن زمانێ ئینگلیزیو عەرەبیو کوردی، هەروەسا دوگمێن تایبەت بۆ ژمارانو هێماییێن دەولەتی و هندەك هێماییێن دی ل سەرهاتینە چێکرن. ب شێوەکێ گشتی (کیبۆرد) بۆ پێدانا زانیارییان بۆ کۆمپیۆتەری ب شێوەکێ نڤیسینێ دهێتە بکار ئینان.



## ( ماوس ):

ئەڤەژی ئامێرەکێ بچووکە بۆ پێدانا پێزانینێن کۆمپیۆتەری دهێتە بکارئینان.

بەلێ ب شێوەکێ داگرتنا دوگمێن لسەر کو دبێژنێ کلیککرنا هێمایان، (ماوس) وەکی تیرەکێیە ل سەر مۆنیتەری دەردکەڤیت، ب لڤاندنا (ماوس)ی ب ساناهی ئەڤ تیرە دلڤیتو دچیتە جهێ مەرەم ژێ کار پێ دهێتەکرن.

### (سپیکەر) یان ئامیرێ دەنگی:



پێکهاتییە ژ وی ئامیرێ گوهی بۆ گوهلێبوونا دەنگی دهێتە بکارئینان.

چ ل وەختێ کار پێکرنا (سی دی) یان بیت، یان ژی ئەو پێزانینێن کو ب شێوەکێ دەنگی لناڤ کۆمپیوتەری هاتینە پاراستن.

## راهێنان (١)

بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ بدە:

١. کۆمپیوتەر ب چ کار دکەت؟

٢. کۆمپیوتەر کارو فەرمانێن مرۆڤی چ لێ دکەت؟

٣. کۆمپیوتەر ژ چەند بەشو پارچان پێکهاتییە؟

## راهێنان (٢)

ب کورتی لـسەر، ڤان بەش‌و پارچێن کۆمپیوتەری بنڤیسە:

١. (مونیتەر)　　٢. کیبۆرد　　٣. ماوس　　٤. سپیکەر

## چالاکی

مامۆستایێ هێژا: ب کورتی بەحسێ کۆمپیوتەری‌و بکارئینانا وی بۆ قوتابییان بکە، هە کە ل قوتابخانێ کۆمپیوتەرهەبوو نیشا قوتابییان بدە، هەکە نەبوو، تو دشێی قوتابییان ببەیە سەنتەرەکێ کۆمپیوتەری.

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| ب هووری | : | بە وردی |
| دوگمەدار | : | ژ ژ مارەکا دوگمان پێکهاتییە |

# خۆگۆریکەرەکا کورد



جوانه مەرگ لەیلا قاسم سالا (١٩٥٣)یێ زاییني ل باژێرێ خانەقینێ ژ دایکبوویەو، چاڤێن وێ ب دیمەنێن جوانو قەشەنگێن ڤی باژێری بشکڤتن، بەژنا وێ دگەل هۆشو بیرێن وێ ڤێکرا مەزن دبوون.

خواندنا خۆیا سەرەتاییوناڤنجی و ئامادەیی ل خانەقینێب دوماهی ئینیاینه، تا پۆلا چوارێ کولیجێ ل پشکا کۆمەلایەتی ل کولیجا ئادابێ ل زانکۆیا بەغدا خواندییە.

لەیلا قاسم شێرە کچەکا کورد بوو،بجەرگەکا چاڤنەترس بوو، خوینا کوردینییێو ریبازا بارزانییێ نەمر دهەمی دەمارێن وێدا دگەریا. لەیلایێ جهێ خۆ دناڤ ریزێن ئێکەتییا قوتابیێن کوردستانێدا کربوو دمەیدانا خەباتێدا گەلەکا ب بزاڤ بوو.

رژێـما بەعسا فاشست وەك هەرجار سۆزو پەیمان شكاندن، وێ رژێمـێ پیلانەك دسەریدا بوو بۆ خاپاندنو نەهێلا نا گەلێ كورد. پشتی كو فەندو فێلێن رژێمێ سەرنەگرتین ، بهارا سالا (١٩٧٤)ێ زایینی دەست ب شەڕی كرە ڤەو هێرش كرە سەر كوردستانێ.

لەیلاییێ دناڤ شانەیەكا چەلەنگێن خەباتێدا بزاڤا خۆیا پیرۆز ب هزر ترو گەرمتر لێكر. بەلێ مخابن پەنجێن دوژمنی گەهشتنە لـەیلاییێو، سـیخوڕێن رەگەز پەرست ئەو و هەڤالێن وێ گرتن.

لەشێ نازكێ ڤان گەنجێن نازدار لبەر ئەشـكەنجەدانێ هاتـە هنجـنین، بەلێ خۆ راگرییا وانو ترس و سەهما پێشمەرگەیێن دلێـرێن كـورد ددلـێن دوژمنـاندا وەكی ئاگری پتر گەشو گەرمو گوڕ بوو. لەوا ژی دلڕەشان كەرب و كینا خۆ ژڤان گەنجان دەركرو، بڕیارا سێدارەدانا لەیلاییێو هەڤالێن وێ دا، ناڤێ لەیلا قاسم هەرمایەو نامریت.

# راهێنان

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. لەیلا قاسم کەنگیو ل کیڤە ژ دایکبوویە؟

٢. رێککەڤتنا ١١ی ئاداری دناڤبەرا کیو کی دابوو؟

٣. مەرەما فاشستان ژ رێککەڤتنا ١١ی ئاداری چ بوو؟

٤. بۆچی دوژمن ژ پێشمەرگەی دترسا؟

# چالاکی (١)

سیفەتێن چاکێن پێشمەرگەی زۆرن، شەش قوتابی، هەر ئێك سیفەتەکی ژڤان ببێژیت.

- کریارێن خرابێن رژێما بەعس گەلەک زۆرن، شەش قوتابی، هەر ئێك کریارەکی ژوان ببێژیت.

# چالاكی (٢)

خوێندكارێن خۆشتڤی:

ناڤێن سێ ژنێن ناڤدارێن كورد ل بواریّ سیاسی، كومەلایەتی: رەوشنبیری بنڤیسە.

١. ...................

٢. ...................

٣. ...................

ئەگەر پێدڤی بوو، بلا مامۆستا هاریكاریا تە بكەت.

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| خۆ گۆریكەر | : | قوربانی، خۆ بەختكەر |
| پشك | : | بەش |
| چەلەنگ | : | چالاك |
| هەرجار | : | هەموو جارێك |
| خاپاند | : | سەردابر |
| نەهێلان | : | لەناوبردن، ژناڤبر |
| بزاڤ | : | جوولانەوە |
| مخابن | : | بەداخەوە |
| فاشست | : | رەگەزپەرێس، توخم پەرێس |

# شەرەفخانێ بەدلیسی



شەرەفخان کوڕێ میر شەمسەدینێ کوڕێ میر ئەشرەفییە. ژ بنەماڵا میرێن فەرمانڕەواییێن بەدلیسێیە، ل سالا (١٥٤٢)ی زایینی بوویە ل ساڵا (١٦٠٤)یێ زایینی مرییە.

هەر ژگەنجی و لاوینییا خۆ ل ماڵا شاهێ ئێرانێ هاتییە پەروەردەکرن و کەڤتییە بەر خواندنێ و وەکی شاهزادان هاتییە بخودانکرن. هەمی رەنگێن هونەری خواندینەو تێدا سەرکەڤتی بوویە. ددیرۆک ناسینێدا گەلەك ژێهاتی بوویە. کارەکێ وەسا د مەیدانا دیرۆکێدا کرییە کو هەمی کەسەک قەرداری نڤیسینا وی بوویە، دیرۆکا کوردستانێ و ناڤێ باب و باپیرێن خۆ کومیرێن بەدلیسی بوون نەمر کرینە.

شەرەفناما وی کارەکێ مفاداریێ مەزنە کو بۆ پاداشا کەسێ نەکرییە، هەر وەکی د دوماهییا وێدا گوتییە ئەز خۆ بەختیار دزانم‌و شانازییێ دکەم کو من خزمەتا نەتەوێ خۆکرییەو ئەز هاتیمە ڕێزا نڤیسەرێن کورد پەرست.

شەرەفخانی ئەڤ پەرتووکا دیرۆکنڤیسا خۆ کو ناڤێ وێ شەرەفنامەیە ب زمانێ فارسییا سەردەمێ سەفەوییان نڤیسییە.

سەیدا هەژار موکریانی شەرەفنامە ژ زمانێ فارسی کرییە کوردی‌و نهو ئەڤ شاکارە هاتییە وەرگێڕان بۆ گەلەک زمانان‌و جهەکێ مەزن‌و فرەهـ د پەرتووکخانێن جیهانێدا گرتییە.

# راهێنان

ڤێ نڤیسینا دناڤ کڤانانذا دووجاران د دەفتەرا خۆدا بنڤیسە:

(شەرەفخانی دیرۆکا کوردستانێ و ناڤێ باب و باپیرێن خۆ کو میرێن بەدلیسێ بوون نەمر کرینە).

(ئەز شانازیێ دکەم کو من خزمەتا نەتەوێ خۆ کرییە و ئەز هاتیمە رێزا نڤێسەرێن کورد پەرست).

# چالاکی (١)

١. شەش قوتابی، هەر قوتابییەک سیفەتەکا باش ببێژیت کو دکوردەوارییێدا هەیە، یان حەز ژێ دکەن.

٢. شەش قوتابی، هەر قوتابییەک سیفەتەکا خراپ ببێژیت کو دکوردەوارییێدا نینە یان نابیت هەبیت.

# چالاکی (٢)

## خویندکاریٚ خۆشتقی:

هەولٚبدە هندەك زانیارییان لسەر ڤان دوو دیرۆکنڤیسیٚن کورد پەیدا بکەو د دەفتەرا خۆدا بنڤیسە:

١. محەمەد ئەمین زەکی بەگ.

٢. دکتۆر کەمال مەزهەر.

بلا مامۆستا هاریکارییا تە بکەت.

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| رەنگ | : | جۆر |
| دیرۆک | : | میٚژوو |
| ژیٚهاتی | : | لیٚهاتوو |
| نهو | : | ئیٚستا |
| فرەهـ | : | فراوان |

# رێنمایێن هاتن و چوونێ








وەکی هەمی بزاڤێن گشتی،هاتن و چوون درێك‌و جاداندا کارەکە چەند رێنمایی رێك دئێخیت، ئەڤ هاتن و چوونە ژی ب شێوازەکێ رێك‌و دروست تشتەکێ گران نینە، دیارە پێگیری کرن ب رێنماییان تشتەکێ گەلەک پێدڤییە، چونکی باژێرێن ڤی سەردەمی ب سەدان هەزار بەلکی ب ملیۆنان مرۆڤ تێدا دژین‌و، هەکە هەر کەسەک ژپیادەو ماتۆر سویارو شوفێران پێگر نەبن بۆ ب جهـئینانا ڤان شیرەت‌و رێنماییان کو پەیرەوکرنا وان دبیتە هۆکارێ هاتن و چوونەکا ب رێکوپێك د باژێراندا هاتن و چوون لناڤ جادان دبیتە تشتەکێ زۆرێ ب زەحمەت، ژبەرهندێ پێدڤییە بۆ هەر تشتەکی پێگیریێ ب رێنماییان بکەین. بۆ نموونە ب هیچ رەنگەکی نابیت ل سەر جادان‌و رێکێن گشتی یاریان‌و راهێنانێن وەرزشێ بکەین. هەروەسا مرۆڤێ شارستانی نابیت بەرمای وگلێشی بهاڤێژیتە سەرجادان‌و کۆلانان، هەکە تو ب پێیان بی‌و تە بڤێت ژ جادەکا پڕی ترومبێل دەربازببی، بەری تو دەربازببی پێدڤییە بەرێ خۆ بدەیە لایێ راستێ‌و چەپێ‌و بێ گیرو بوون دەربازببی.

هاژۆتنا ترومبێلێ ژی چەند مەرجێن تایبەت هەنە، ژوان مەرجان پێگیرییا شوفێری ب نیشانێن تایبەتێن هاتن و چوونێ، ژوان ژی نیشانێن هاتن و چوونێ (ترافیك لایت)، ئەوێن پایسکلان ژی دهاژۆن نابیت ل سەر جادان بەریکانێ دگەل هەڤدو بکەن یان بارێن گرانو خەلکێ دی دگەل خۆ سویار بکەن. هندە جاران خودانێن پایسکلان ل سەر لیڤێن جادێ دچن یانژی دێ دەستێ خۆ هاڤێژنە ترومبێلەکا دی ل دووڤ ترومبێلێرا چیت، دیارە ئەڤە ژی مەترسییە کا مەزنە. مرۆڤێ شارستانی دۆستێ یاساییە، پێدڤییە پێگیربیت ب نیشانێن دەربازبوونا پیادان، ئەڤ نیشانە پێکهاتینە ژ چەند هێلێن رەنگ سپیو تەریب کو ل سەرجادان هاتینە کێشان، هەر دەمەکێ قوتابیو خەلکێن دی یێن پیادە ل جهێ تایبەت بۆ دەربازبوونا پیادان دەربازبوون هینگێ دێ خۆ دوور ئێخن ژ هەمی روودانان. هەمی سویارێن پایسکلان پێدڤییە زۆر ب هۆشیاری بهاژۆن، ب تەمامی پێگیر بن ب نیشانێن هاتن و چوونێ، چونکی سویارێن پایسکلانو سویارێن ماتۆران ژی وەکی شوفێرینە، پێدڤییە ئەو یاساو رێنماییێن شوفێر ل سەر ددچن ئەو ژی لسەر بچن.

ئێك ژ سیفەتێن دیار یێن کۆمەڵگەهێن شارستانی یێن ئەڤرۆ، پێگیربوونو پەیرەوکرنا یاساییێو ب جهئینانا رێنماییێن تایبەت ب هات و چوونێڤە، هەر کۆمەڵەکـ ئەڤێ پێگیرییێ ژبیربکەت دێ تووشی بێ سەرو بەرییێ بیت.

ژبەر هندێ پێدڤییە ئەم هەمی، ب تایبەت ئەم قوتابی، ببینە بەراهیکـ دڤی بواریدا بۆ هندێ دا خەلکێن دی ژی چاڤ ل رەفتارێن مەیێن جوان بکەنو، ب ڤان کریاران ژی بسەلمینین کو قوتابی زەلامێن پاشەرۆژا ڤی میللەتینە.

## پرسیارو دانوستاندن

**بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:**

١. هەکە تەڤیا ژ جادەکێ دەربازبی پێدڤییە چ بکەی؟

٢. هێلێن سپی یێن تەریب لسەر جادان نیشانا چییە؟

٣. ئێك ژ مەرجێن هاژوتنا ترومبێلێ چییە؟

٤. هەکە ئەم رێنماییێن هاتن و چوونێ ب جه نەئینین دێ تووشی چ بین؟





## چالاكی (١)

نیشانێن هاتن و چوونێ (ترافیك لایت)
سێ رەنگن، ڤی وێنەیێ بەرامبەر رەنگ
بكە ، هەر رەنگەكێ ژوان نیشانا چییە
ل بەرامبەر بنڤیسە.

## چالاكی (٢)

**خویندكارێن خۆشتڤی** / هندەكێ ژوان نیشانێن هاتن و چوونێ رێك دئێخیت ئەڤێن ل خوارێنە . باش بەرێ خۆ بدەوان و فێرببە ، دێ پاشەرۆژێ مفای ژێ وەرگری.










# واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| بزاڤ | : | چالاکی |
| شیرەت | : | ئامۆژگاری |
| هاژوتن | : | لێخورین |
| یاسا | : | قانون |
| بسەلمینین | : | بنەجھ بکەین |



# تەپڵ[١]



هەر چیم هەیە لێم وەرگرە
لەشم، ناوم، جووڵەم، تینم
بیگروو پێستی ئەندامم
بیکە بە بەیداخی ژینم
بەرەڵایکە هەوری توانج
بۆ ئەستێرەی بەختی ژینم
بەڵام شتێ لە مۆخمایە
(ئەتۆم) نایهێنێتە دەرێ
هیچ دەسەڵاتێ ناتوانێ
پەناو زەفەری پێبەرێ
ئەزانی چی؟ ئەمن کوردم
گەڵای کوردانەم ناوەرێ

## چالاکی

چەوان ب راستی دێ نەتەوێ خۆ پارێزی؟
چەند رێزەکەکان لسەر بنڤیسە.
تەپڵ: تمبڵك

---

(١) پارچەکە ژ هۆزانەکا درێژا (دیلان)ی کو ب ناڤێ (تەپل) هاتیە، دیلان... ناڤێ وی محەمەد صالحێ کورێ مەلا ئەحمەدێ دیلانە، سالا ١٩٢٧ ل سلێمانیێ ژ دایکبوویە. تا پۆلا سیێ ناڤنجی خواندیە. ژبەر هەلویستێ وی یێ نیشتمانپەروەری هاتیە زیندانکرن. سالا ١٩٩١ی چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ‌و ل (گردی سەیوان) هاتیە ڤەشارتن.

# نەجمەدین مەلا



نەجمەدین مەلا کورێ مەلا غەفورێ عەلییە ، دچیتە سەر بنەماڵێن میرێن خدرێ شاهۆ. ل سالا (١٨٩٨)ز ژدایکبوویە.

چل سالاًن خزمەتا ئەدەبێ کوردی کرییە، ل رۆژناما (ژین) چەندین چیرۆك بۆ زارۆکان نڤیسنەو چەندین چیرۆکێن بیانی وەرگێڕاینە سەر زمانێ کوردی، ئەڤە ژبلی هەولدانا وی بۆ پێناسینا شاعیرێن مەیێن ناڤدار

نەجمەدین مەلا دوژمنێ نەخویندەوارییێ بوویە، بۆ نەهێلانا نەخویندەوارییێ پێشمەرگەکێ دل قایم بوویە، ژ بەرڤێ مەرەمێ قوتابخانەکا بچووک ل سلێمانییێ ل سەر جادا سابوونکەران ب ناڤێ قوتابخانا (کەشتی نوح) دامەزراند، دژی نەخویندەوارییێ دەست ب خەباتەکا بێ راوەستیان کرییە، ل ماوێ چل سالاندا نێزیکی حەفت هەزار کەس ژ نەخویندەوارییێ رزگار کرینە.

ئارمانجا وی بۆ مەبەستا ڤان قوتابخانان هەستا نەتەوەیی دمەژییێ فێر خوازاندا بچەسپینیت، مامۆستای ئەلفو بێیەکا تایبەت بۆ خۆ دانابوو، ب رێنڤیسا نوو فێردکرن. رێز ل قوتابییان دگرتو، دلەکێ فرەهـ هەبوو. گرنگی دابوو بابەتێ باشنڤیسێ.

ل سالا ١٩٦٢ چووییە بەر دلوڤانیا خودێ، لسەر وەسیەتا وی لسەر کۆپێ چیایێ ئەزمەر هاتییە ڤەشارتن، بۆ وەفاداریا ڤی مامۆستای و رۆلێ وی،باژێرێ سلێمانییێ قوتابخانەکـ ل تاخێ بەختیاری ب ناڤێ (نەجمەدین مەلا) هاتییە بناڤکرن.

## چالاکی

ڤان ڤالاهییان ب ناڤەکێ گونجای پڕ بکە:

١. رۆژناما (ژین) ل باژێرێ ............... دەرکەڤت.

(هەولێر، کەرکووکـ، سلێمانی)

٢. مامۆستا نەجمەدین مەلا قوتابخانا ............... دامەزراند بۆ نەهێلانا نەخویندەوارییێ.

(ئامادەیی، کەشتی نوح، ناڤنجی)

٣. لسەر وەسیەتا خۆ لسەر کۆپێ چیایێ ............. هاتە ڤەشارتن.

(حەمرین، ئەزمەر، گارە)

# دانوستاندن د ناڤبەرا دارێو داربڕیدا



زارۆکێن خۆشتڤی: رۆژەکێ دناڤ دارستانەکێدا دانوستاندن دناڤبەرا دارێو داربڕەکیدا هاتەکرن. من گوهداری دکر کا دێ چ بێژن دا بۆ هەوە ڤەگێرم.

فەرموون هوونو دانوستاندن:

دارێ: (ب سلبینیو خەمڤە) گۆت: تو چەندێ بێ دلۆڤانی دوهی تە چەقو قورمێ هەڤالا من بڕین، ئەڤرۆژی تو یێ ئامادەیی من بکوژی! ئەرێ تو دزانی ئەڤە چەند سالە ئەز رەهێن خۆ دادهێلمە ئەردی دا ئەز خزمەتا هەوە مرۆڤان بکەم، بەلێ مخابن داربڕەکێ وەکی تەیێ بێوژدان ناهێلیت خزمەتا هەوە مرۆڤان بکەم.

داربڕی (ب سلبینیو کەنیڤە) گۆت: تە بۆ مە چ خزمەت کرییە؟

تو بۆ سوتنیێو برینیێ باشی، ئەز ل ماڵ تو ل ڤی چۆلی، تـو نابێژییـە
من تە چ مفا بۆمن هەیە؟

دار: چەوا من مفانینە؟! ئەریێ توو هەمی مرۆڤ بەرهەمو فیقییـێ مـن
ناخۆن؟

ئەریێ وەختیێ سـەیرانان ل ڤـان دەشـتو دولاّن، تـو لـبن سـیبەرا مـن
بێهناخو ناڤەدەی؟ ئەریێ ئەز نینم دگەل گیاو گولاو خـەملا بهـاریێ جـوان
دکەمو دلیێ مرۆڤانخۆش دکەم. داربڕ: ئاخاڤتنێن تە دراستن.

دار: مفایەکیێ من ییێ دی ئەوە جەنابیێ تـە دووەم ئوکـسیدیێ کـاربۆنی
دروست دکەت چ ب ترومبێـلاتە بیت یان دویکێلاویێ جگاریێ بیت ئەوا تو
دکێشی. ئـەز وی دووەم ئوکـسیدیێ کـاربۆنی دمێـژمو ئوکـسجینیێ پاقـژ
ددەمە هەوە.

داربڕ: شەرمە، دەمیێ تو باشیەکیێ دکەی تە ئەو باشی چەوا کرییە تو
وەسا دبێژی؟

دار: ئەز هەمی دەمان بەحسیێ باشیێن خۆ ناکەم، چونکی ئەڤە سـەریێ
چـەند سـالاّنە ئـەز خزمـەتا ڤـی وەلاّتـی دکـەم، چ جـاران چـاڤیێ مـن ل
سوپاسییان نەبوویە.

بەلیێ ژبلی زیانان تـە چ مفایـەکیێ دی نەبوویـە. ویێ رۆژیێ تـە چـەقو
قورمیێ هژیرا هەڤالا من برین، تو دهاتی لبن سیبەرا مـن تـە بێنـا خـۆ
ڤەددا، ئەز دشیام چەقەکیێ خۆییێ مەزن بەردەمە سەر سەریێ تە بەلیێ ددلیێ
من دانە دهات وە بکەم، چونکی تو لبن سیبەرا من بووی.

داربڕ پاشی ل بڕینا داریّ پەشیّمان دبیتو، بڤریّ خوّ دهاڤیّژیتو دبیّژیت: ب شەرتەکی ئیّدی ئەز دارا نەبڕم ل جهیّ بڕینا داران ئەز شتلو نەمامان بچینمو خەملا وەلاّتیّ خوّ تیّکنەدەم.

## راهیّنان

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١. داروبار چ خزمەتیّ بوّ مروّڤان دکەن؟
٢. ب بڕینا داران خەملا وەلاّتیّ مە دیّ چەوا بیت؟
٣. ژبلی سیبەرا داران بوّ بیّن ڤەدانیّ، داریّ چ مفاییّ دی هەیە؟
٤. شوینا بڕینا داران ئەم چ بچینین؟
٥. مفاییّ داران بوّ ژینگەهیّ چییە؟

## چالاکی (١)

خویندکاریّ خوّشتڤی:

ناڤیّ چەند داران بنڤیسە کو ئەم بوّ جوانیا خەملا باژیّڕان دچینینو، ناڤیّ چەند داران بنڤیسە کو ئەم بەریّ وان دخوّین.

## چالاکی (٢)

مامۆستایێ هێژا:

ب کورتی بەحسێ هندەک دارو بارێن بەردارو بێبەر بۆ قوتابییان بکە.

## واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| داربڕ | : | ئەو کەسە ئەوێ داران دبڕیت. |
| فەرموون | : | کەرەمکەن |
| بڤر | : | ئامیرەکە بۆ بڕینا داران بکار دهێت. |
| نەمام | : | شتل |

# ژینـــــــگەهـ



ژینگەها مرۆڤان وی جهی ڤەدگریت ئەوێ مرۆڤ ل سەر دژین و ئەو تشتێن ل دەوروبەرێن مە هەین، کارتێکرنێ ل سەر ژیانا مە دکەن وەکی ئاڤێ و هەوای و ئاخێ. پیسبوونا ژینگەهێ کارتێکرنەکا ئێکجار خراب یا هەی ل سەر ساخلەمیا ژیانا مرۆڤان و گیانلەبەران. خەمساری ب هاڤێتنا گلێشی و بەرماییان ل کولانان و مەیدانان وجادان و پیسکرنا دیواران ب تایبەت قوتابخانان و جهێن گشتی پویتە نەدان ب باغچان و دار و باران و زۆربوونا قەلەبالغیێ ل جهێن گشتی، هەروەسا دوکێلا ترومبێلان و کارگەهان وجگاران و گەلەك تشتێن دی، ئەڤە هەمی ئەو هۆکارن ئەوێن جوانیا ژینگەها وەلاتێ مەپیس دکەن.

خويندكاریٚ خوٚشتڤی: پیٚدڤییه توژی ملیٚ خوٚ بدهیه ملیٚ مهزنانو ههولبدهی ژینگهههكا پاقژو بژین راگری...

ل دهسپیٚكیٚ ژ مال و قوتابخانیٚ دهست پیٚبكهی، ب هاریكاریا مه ههمییان دیٚ ژینگهههكا پاقژو ساخلهمیهكا جوان دابین كهی پیٚدڤییه ئهم ههمی دلسوٚزو خهمخوریٚن ژینگهها خوبین، ههست ب بهرپرسیاریێ بكهین ل مالو قوتابخانهو كوٚلانو سهیرانگهه و جادان. پیٚدڤییه خوٚدوور بیٚخین ژ ههمی وان كاروكریاریٚن دبنه ئهگهریٚ پیسبوونا ژینگههیٚ چونكی ب پاقژییا ژینگههیٚو جوانیا باژیٚران دلسوٚزیا خهلكیٚ مه دیار دكهت.

## راهیٚنان

ڤان ڤالاهییٚن ل خواریٚ ب پهیڤهكا گونجای پرِ بكه:

١. ژینگهه وی جهی ڤهدگریت .............

٢. ............. دبنه ئهگهریٚ پیسبوونا ژینگههیٚ.

٣. پیٚدڤییه لسهرمه ............ ژینگههیٚ بپاریٚزین.

٤. ب پاقژیا ژینگههیٚو جوانیا باژیٚران دلسوٚزیا ............ دیاردكهت.

# چالاکی

**مامۆستایێ هێژا:**

بۆ قوتابیێن خو بێژە هەکە هوون وەك قوتابخانە چوونە سەیرانێ دێ چەوا ژینگەهێ پارێزن.( بکە بابەتەکێ دارشتنێ )

# واتا پەیڤان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| ساخلەمی | : | تەندروستی |
| بێ بایەخ، خەمسار | : | کەمترخەم |
| دەنگە دەنگ، قەلەبالغ | : | ژاوەژاو |
| خاوێن | : | پاکژ |
| هەڵبدەی | : | بزاڤێ بکەی |

# شینی‌و تازیا شەهیدا

شـــینی‌و تازیـــا شـــەهیدا ئـــەم ژبـــیر ناکـــەین چـــوجار
دێ ڤەکـــەین تـــۆلا نـــەهنگا وەختـــەکێ زێـــڕین بـــژار

وان مـــەغولا راڤ دبەســـتن شـــێرو مێـــر ســـەردهنجنین
تـــوخم‌و نڤـــشێ وان قەلانـــدن هـــەمی گاڤـــا دپەچـــنین

تورکا گرتن شێرو مێر چـاك دەسـت پـێ لێ قەیـدکرن
کـــەت بکـــەت گـــرتن‌و کوشـــتن لـــبن ســـێپێکا خرکـــرن

رســـتکا شـــەنقێ بـــۆ دانـــا خەندقانـــد پـــارێز وەلات
شێخ ســـەعیدێ جـان فیـدا مر رەشە رۆژەك بۆمـــە هـــات

ئـــەو رۆبـــادێ قەبقـــەبی چـــو ئـــاخ‌و زاری بـــوون بلنـــد
چوو دلێ شێری ژناف مەبێ خودان مان دەشـــت‌و گونـــد

بـــۆقێڕی زێمـــارو شـــینی کـــو وەلات مـــابی خـــودان
پۆسیدە دلسۆژو خەمگێر هـــەر هـــەوارێ دکـــەن ئـــەمان

مەلا تەهایێ مایی کوڕێ شێخ مەزهەری کوڕی شێخ تەهایێ مایی یە، ل شواتا سالا ١٩٢٤ل گوندێ مایێ سەر ب دەڤەرا بەرواری ژووریڤە ل پارێزگەها دهۆکێ هاتیە دونیایی‌و ل ٢٥/١١/٢٠٠٠ێ ل بازێڕێ دهۆکێ چوویە بەردلۆڤانیا خودێ.

